ناوی کتێب : ڕەشبەڵەکی ڕۆح
نووسەر : ناڵە حەسەن
بابەت : شیعر
پیتچنین : نووسەر
چاپ : چاپی دووەم ( چاپی ئینتەرنێت )
تابلۆی بەرگ و ناوەوە : ئینتەرنێت

پێشکەشە :

ڕەشبەڵەکی ڕۆح .. پێشکەشە
بەو پەپوولە بێگوناهانەی کە غەریزە چەپێندراوەکانیان
بە شیعر تێر دەبێت و لە نێو لەزەتی ڕۆحیدا دەتوێنەوە ...!

قەسیدەی

# کەژاوەی خۆرەتاو

بە پەیژەیەکی بازنەیی
بێ سەرەتا و
بێ کۆتایی سەردەکەوم
تەمەنم لە ناو تەونی جالجالۆکەیەکی
ڕەنگ خۆڵەمێشی دەڕشێتەوە
زوڕناژەنەکانی چەرخی بەردین ، بووکەشووشە
لە تارمایی شەو دروست دەکەن
من و شیعر و من و دایکم
لەگەڵ فرمێسکە بارانی ئەم سەردەمە
بە خشخشۆکێ
بە سەر گۆنای مانگ دێینە خوارێ
لە هوتێلی شەقامە سەرابیەکانی ئاسمان بێزارم
نە چرکەی کاتژمێرێک
نە خورپەی دڵی باڵندەیەک
نایەتەگوێم

خەونەکانی پێش لەدایکبوونی خۆم
بە بیرنایە
هەتاوی بەیانییە بەفرینییەکان سەرخۆشن
ناوکی درەختی مەلۆتکەی دڵم
بە تفەنگ دەبڕن
سەماکارە چیاییەکان
لەژێر ڕەشماڵێکی دڕاو
بنێشت دەجوون
سەروتیتکیان تێکئاڵاوە و
تادێ زێتر ڕووت دەبنەوە
شەپۆلی ڕووباری شیعرم
لە سەرەتای مانگی شەختەبەندانی هەرچوار وەرز
بەئاگردانی سەر سینگی گەورە کچان
خۆی گەرم دەکاتەوە
مێژوو ، گەردەلوولێکی دەروێشییە
لە ناو دەمارەکانی سەرم دەست پێدەکات و
لە سەر پێڵوی چاوەکانم کۆتایی دێت ...!

پێش ئەوەی لە دایک بم
خۆلی سەر دیواری گومبەزەکانیان دەکردە چاوەکانم
بە چڵکاوی جۆگەلەکانی شەوەزەنگ
نینۆکەکانمیان ڕەنگ دەکرد
پاییز ، وەرزێکی غەریب و بێدەنگە
پاییز دایکمە ، دوێنێ بە سکی ئاوسەوە
هاتە لام و تێر تێر گریا
منیش گۆنا بە چرچ و لۆچەکەیم
تێر ماچ کرد و بەشانەی خۆرەتاوی ڕۆحم
پرچە سپییە بێگوناهەکەیم داهێنا
لەم ئۆردوگایە تەلبەندراوە
ئاسمان ڕەشە ، هەور ڕەشە
لە دایکبوون ڕەشە
خۆرەتاو تا دەگاتە جێژوانی کازیوە
دەبێ بەسەر لاشەی شەو ڕێ بکا
بزنە کێویی نێو ئەشکەوتە تاریکەکانیش
ڕقیان لەو ڕووبارانە دەبێتەوە

که هەموو بەیانیان خۆیان ڕووت دەکەنەوە و
لەسەر گازی پشت لێی ڕا دەکشێن
تا خۆرەتاو دێت و ماچیان دەکات
ڕقیان لەو پەپوولە و لەو بنجە گیایانە دەبێتەوە
کە لەگەڵ گۆرانیەکانی ڕووبار
بە خەبەر دێن و
هەر بە ڕووتی دەکەونە سەما
من کە هاتم
بە پێ خاوسی دەگەڕام
شەقامەکان بە وردە شووشە دانەپۆشرابوون
دڕکەلوکی میمی پاشگر ، لە هیچ ئاقارێک دیار نەبوو
کچ و کوڕ پێکەوە دەچوونە ڕێواسان
بە ڕەهایی سەرم بە کۆشی دەسگیرانەکەمدا دەکرد
لەناو چاوەکانیدا
گوڵی بەهەشتیم بۆن دەکرد
من کە هاتم
گەرم پێوەکان بە درۆ گەرمایی لەشمیان
نەدەخوێندەوە

هێندە وەکو منداڵ
حەزم لە سواری چەرخ و فەلەک نەدەکرد و
لەناو پەیژەی بازنەییدا
ئەژنۆکانم شل نەدەبوون و باوێشکم نەدەهات
ئێستا باوەڕم بە لێدانی دڵی خۆم و
دڵی پەپوولە نەماوە
چاو لە یەکەم وێستگەی هاتنم دەگێڕم
برژانگەکانم دەسووتێن و ئەوسەری شەقامە
قیرتاوکراوەکەی خۆم نابینم ...!
ئێستا ، بەفر پێکەنینی مردن
لەسەر لووتکەکان جێدەهێڵێ
بە چاوەکانی خۆم لەناو دڵی زەوی
مەشخەڵی ئاگر دەبینم
لێمگەڕێن
با تەزووی ماچی لێوی خۆم و
لێوی گوڵەباخ لە هەنگوین هەڵبسووم
دەمم دامەخەن ، زمانم مەبڕن ، قەڵەمەکەم مەشکێنن
با کرمی ناو سێوە ڕزیوەکانی شەوەزەنگ بێنمە دەرێ و

لەگەڵ پوش و پەڵاش و پەلەهەورە ڕەشەکان
لەبەردەم با دایان بنێم
دەلێمگەڕێن
من برووسکەم
من خوێنی ناو دڵی منداڵێکی هەرزەکاری ڕەنگ زەردم
پەراسووەکانی گوڵەگەنم و
هەناسەی تاڤگەی ئەوینم
دەلێمگەڕێن ، فرمێسکم ئاوی حەیاتە و گۆزەی تەنیاییم
لەسەر کانیەکانی ئاسمان مەشکێنن
قێز لە لایلایە و لە گۆرانیەکانی شەوانم
مەکەنەوە
من لە  سکی ڕەشماڵی با لە دایکبووم
لەسەر پشتی ڕووبار مەمکی ئەستێرەکانم مژیوە
ئەو دەمانەی کەزییە درێژەکانی تاریکی دەبڕم
شەو لەبەر سێبەری مەرگ
چاوم لێ سوور دەکاتەوە و
فتوای کوشتنم دەردەکات
من نامرم ، وا تازەبەتازە بەفری کەنار

هەردوو مەمکەکانم دەتوێنەوە
وا تازەبەتازە ،
مژدەی چوونە ناو چاوی هاوارم هێناوە
لە شەوی ئاوزینگدانی ئادەم
لە شەو ئاوزینگدانی مەرگ
من پەیامی ( شەوە سپیەکانی ) خۆم
بڵاو کردەوە و
شنەبای ئارەزووەکانی خۆم بەرەڵا کرد
لەگەڵ ڕووەک و باڵندە سبیەکان
بەرەو ئاسمانێکی سپی ساماڵ وا کۆچ دەکەین
شەو لەبەر ڕۆشنایی ڕووبارە سپیەکان
نەیتوانی بزێ
شەپۆلی ڕووباری کازیوە
لە شەوی ئاوزینگدانی تاریکی لە دایک بوو
شەوەزەنگ مرد
شەوەزەنگ سکی ڕەشی
چەندین ساڵەی لەبارچوو

ئێستا هەموو ئەستێرەکان و
کەژاوەی خۆرەتاو و ڕەنگی زیوینی بەفر و
بزەی باران دەزانن
شەوەزەنگ نەزۆکە ...!
ئێستا ، بریسکەی چاوی پشیلە و
کڵپەی سووتانی شیعر و
خوناوی سەر پەنجەرەی عەشقە ئەبەدیەکان
دەزانن
شەوەزەنگ نەزۆکە نەزۆک ...!

گەر سەری من بانیژەی ئاسمان با
نەمدەهێشت
بە پەیژەی نامۆیی و خۆکوشتن سەرکەون
ئاوێنەی پرچی شەو دەرکەوێ
نەمدەهێشت
لە نیگای مانگەشەو
تابووت بۆ پەنجەکانم دروست کەن

بزەی خەم گەردانەی
گەڵا ڕێزانی ڕۆحتان بێ
دوێنێ شەو
خۆرەتاو لەناو سێبەرم نووستبوو
ئەمرۆش ، لە ناو لەپی دەستم دانیشتووە
بۆ خۆی کۆڵارە دەفڕێنێ
ئێستا ، هەموو دەمارە سڕبووەکانی
پێڵوی چاوم گەرم گەرمن
ڕۆشنایی مۆمەکانی پەنجەم ، هەموو بەیانیان
لەسەر کانی ماڵانی ڕۆحم
سەری تارماییەکان دەشۆن

لەمەودوا ئاگری سەر نینۆکی تاشەبەردەکان
لەژێر بارانی خەونی فریشتە بێگوناهەکان
دەکوژێنەوە
ئێستا ، شەو بەرگێکی سپی سپی لەبەردایە
من و شەو خوشک و براین

لەمەودوا شەو وەکو من
حەز لە خوێندنەوەی شیعر دەکا
ئەو کاتانەی
گوێ لە مۆسیقای ( مۆنامۆ ) ڕادەگرێ
تێر دەگریێ
لەمەودوا پێکەوە
لە شەوانی قەرەجیمان
شیعری قەرەجی دەنووسین و
ماچی قەرەجی لە یەکتری دەکەین و
گۆرانیە قەرەجیەکانمان بۆ یەکتری دەڵێینەوە

شەوەزەنگ مرد
شەو ناتوانێ جارێکی تر
لەسەر چوارپایەی تاریکی بخەوێ
وا ئێستا لەگەڵ
پێکەنینی ڕووبار و هەناسەی خۆرەتاو
بەزمی کەژاوە ڕێکدەخەن

شەوەزەنگ مرد ...
شەوەزەنگ سکی تاریکی لەبارچوو
شەوەزەنگ نەزۆکە نەزۆک ...!

ئەیلوولی ١٩٩٥

# چیرۆکە شیعری
# ڕەشبەڵەکی ڕۆح

یەکەم :

لەگەڵ هاواری ژان و چریکاندنی ڕۆحی مێژووم
یەکەم بەهاری تەمەنم لە دایک بوو
کاتێک ، سوێسکە و پەپوولە و قەلەڕەشکە
دەستیان بە باڵەفڕکە کرد ، ڕووبار و جۆگەلە و کانی
دەمیان بۆ باران کردەوە ، ئەستێرە و مانگ ،
هەور و ئاسمان ، درەخت و گوڵ ، خونا و سەراب
هەموو دەستیان بە سەماکرد .

گوڵە گیان
تۆ لەم ساتە وەختەی پڕ لە نەشئە و پڕ لە
شاگەشکەی خۆشی و سەفا لە دایک بووی
ئەوکاتانەی چاوەکانت هەڵێنا
بەو دەستانەم
وێڵداشی منداڵدانی دایکتم لێت جیاکردەوە و
بە مەمکەکانم شیرم پێدای
چاوەکانم بۆت کردە بێشکە و پەنجەکانم کردە
دەسرازە و بە هەناسەم ڕامهەژەندی

گوڵە گیان
ئەو ساتەوەختەی لە دایکبووی
یەکەم کەس بووم پڕ بە دڵم ماچم کردی
دێتە بیرم ، پێشئەوەی گوڵی فیردەوسی
سەرلێوم بپشکوتن
پەنجەکانم بێ ئێسک بوون ، پشکۆکانی حەز و خۆزگەم

به شنەبای پەرچەمی تۆ
باوەشێن نەدەکرا و
بە قەتماغەی خۆڵەمێشی شەوەزەنگ داپۆشرابوو !
ئەوساتەی تۆش لە دایکبووی
پەنجەرەکانی چاوم نیوە لێل و نیوە ڕۆشن
بەڵام هێشتا
لەگەڵ لە دایکبوونی تۆ . خوێنی ناو دەمارەکانی سەرم
ڕژێنە مردووەکانی تامەزرۆییم ، دووبارە لەدایکبوونەوە
لەو ڕۆژەوە فێرت کردم
شان و ملم بدەمەبەر ئەو پەیامەی لە کۆڵمایە و
سواری پشتی برووسکە بم
گەرم گەرم
گۆرانی بۆ وەرزی هەرزانی بڵێم
لەو ڕۆژەوە فێرت کردم ، سواری پشتی ئەسپی با بم .
گەرم گەرم
ڕێوی ئاشووبی ئەم وەرزە ڕاو بکەم و سەری ببڕم

لەو ڕۆژەوە فێرت کردم
شیعر بکەم بە سەوزایی . بە ئەستێرە ، بە گوڵ
بە نان ، بە عەشق ، بە پێکەنین و هەناسە ...!

هۆ گوڵە گیان
کە تۆ هاتی ، چیتر خۆر لە قوڵایی دۆڵەکان و لە نێو
ئەشکەوت و گومبەزەکان ڕەشماڵی خۆی لێ هەڵنەدا و
چیتر شنەبای ئێواران
چاوی لە درەختی بەهاری ئومێدم سوور نەکردەوە
چیتر بەدوای ناسنامەی خۆمدا نەگەڕام
پێشتر دەنگ و ڕەنگم
هاوار و ژانم ، شیعر و گریانم ، بێ ناسنامە بوون ...!
پێشتر نەمدەزانی
بۆ دەنووسم ؟
بۆ دەگرییێم ؟
بۆ دەژیم و بۆ دەشمرم ؟
کە تۆ هاتی

لە یاسای ژیان و سروشت گەیشتم
کە تۆ هاتی
ژیژکی میراتگری چڵکی دەستی قوڕەیشیەکان
خۆیان گرمۆڵە کردەوە نەوەک
پەرچەمی شەکاوە سوورەکەی تۆ ببینن
عاشقانی ڕەوەز و داربەڕوەکانی چیاش
هەر خەریک بوون بە دەنووکە درێژەکانیان
گلێنەی چاوەکانم دەربهێنن
گوڵەکەی من ..
کە تۆ هاتی و لەگەڵ زەماوەندی
وەرزی ئەم لە دایکبوونەم
مێژووی سکی وەرزە خەمناکەکانی دوێنێم لە باربرد و
گوڵئەستێرەی شیعرێکی ناسکم
لە بەرۆک و سینگی خۆمدا
من ئەمڕۆکە
شاعیرە ڕەنگ هەڵبزرکاوەکەی دوێنێ نیم ...!
ئێستا هاوارم
هاوار و ژانی ئەو بارانەیە

که بۆ زیندووکردنەوەی ژیان لە دایک دەبێ !
لەگەڵ ئەم هاوار و چریکاندنەم
من لە نێو بێشکەی دڵی ڕووبارێکی منداڵانە و هەرزەکاردا
شەپۆلێکی نامۆ و تەنیام
لە ناو کۆشی ئاسمانێکی شەرمناویش
گورزەبریسکەیەکی سەرشێتم ...!

گوڵەکەی من
من دوێنێ خۆم نەدەناسی و لەم دەڤەرەش نابەلەد بووم
کاتێک سواری پشتی برووسکە دەبووم
لە بیابان خۆم دەدۆزییەوە و
گەرووم وشک و چاوەکانم پڕ زیخ دەبوون
کە سواری ئەسپی باش دەبووم
لە قەدپالی چیا و لە ناو ئەشکەوتە تاریکەکان
خۆم دەدۆزیەوە و
بە دەستەکانی خۆم
شەڕابی نامۆییم دەرخواردی خۆم دەدا

بۆ هەرلایەک دەڕۆیشتم
گۆمێکی پڕ لە قوڕەشین بوو
سەیری هەر ئەستێرەیەکم دەکرد
پارچەیەک ئاگر بوو بۆم
هەر کزەبایەکیش هەڵی دەکرد
سەری کاسمی دەڕوتاندەوە
بەڵام ئەی هەناسەکەم
کە تۆ هاتی و لەسەر سینگم چاوت هەلێنا
من ئێستا
پەلە هەورە سەرلێشێواوەکانی دوێنێ نیم
من ئەمڕۆکە
گەر نۆبەرەی وەرزی ئەم لە دایکبوونەشم مێ بێ و
هەموو سکەکانی داهاتووشم مێ بن
هەست بە شەرمەزاری ناکەم
گوڵەکەی من
ژانی لە دایکبوون هەر یەک ژانە
چ مێ بێ چ نێر ...!

من هەموو پەنجەکانی خۆمم خۆشدەوێن
هەموو کۆرپە و گلێنەی چاوەکانی خۆم خۆشدەوێن
من هەموو دڵۆپە فرمێسک و دەمارەکانی خۆم خۆشدەوێن من
هەر چرپەیەک
هەر ئاخێک
هەر بزەیەک
هەر گەردێک
کە لە من لە دایکبووبێ ، پڕ بە خوێن خۆشمدەوێ
من ئەمڕۆکە باڵام
بە قەد دووری ئەستێرەکانەوە بەرزە
خەڵک پۆڵ پۆڵ دێن بۆ دیدەنیم و تێر تێر بۆنم دەکەن
خەڵک پۆڵ پۆڵ دێن لە ژێر سێبەری دارسنەوبەری ڕۆحم
دەحەسێنەوە و دەبن بە گوڵ
لەگەڵ منا تێکەڵ دەبن ...!
هۆ گوڵەکەم
کە تۆ هاتی شوهرەتی من بە هەموو
کەلێن و قوژبنێکی ئەم وڵاتە بڵاوبۆوە

شەپۆلە شەڕانگێزەکانی تۆفان و هەوری چڵکن
کە سەیریان کردم من کێم و چین
کە گوێ یان ڕاگرت چیم دەوێ
ئەژنۆکانیان یەکسەر دەستی بە لەرزین کرد
منیش ، بڵندتر گۆرانیەکانی خۆم گوتەوە
تا وایلێهات بنجە گیایەک نەما
گوێی  لە گۆرانیەکانی من نەبێ
تا وایلێهات ئەستێرەیەک نەما ، سەربەکۆشی
خەونەکانم دا نەکات و لە گریان و پێکەنینم بەشدار نەبێ
گوڵەکەی من
دەپێمبڵێ ، چ مەخلوقاتێکی دڵ بەبرین ماوە ؟
من نەناسێ و تۆ نەناسێ !
دەپێمبڵێ ، چ مەخلەقاتێکی دڵ بەبرین ماوە ؟
شەیدای بۆن و بەرامەی بەهارەکەی ڕۆحمان نەبێ !
ئێستا ،
ڕوانینی گریشمەییم پڕ لە عەشقە و

لێوم کانی بزەی لێ دەردەبێ
ئەم بەهارە خۆشترە لە بەهارەکەی ساڵی پار
شەوان لێفەشرٍەی جەخار بەخۆم دا نادەم و
لەسەر چوارپایەی مەراق ڕاناکشێم ...!
ئێستا کۆتری خەون و هیوام
لە نێو هێلانەی خۆشەویستی بە گمەگمی بەیانیان و
ئێوارانی جەستەی پڕ لە برینم دەهێنێتە جۆش
ئێستا ئەستێرەکانی شەوە سوورەکانی ئەم وەرزەم
گۆرانی دەڵێن
کوکوختیەکانی هەناسەم زۆر دڵخۆشن
گەڵەکەی من
ئەو ساتە وەختەم قەت لە بیرناچێ ، کە هێمن هێمن
لە ناو بەهاری ڕۆحت پڕ بە ناخم دەتوامەوە ...!

دووەم :-

ئێستا شەوە و
گڤەگڤی ڕەشەبا بەردەرگای ماڵی لێگرتووم
جارێکی تریش ڕەشەبا و
زریانی هار و شەپۆڵی شێت و تۆفانی بە ترس
جارێکی تریش
هەتککردنی بسکی ئەستێرە و هەڵکۆلینی
چاوی مانگ و خەتەنەکردنی زیندەوەرە مێینەکان
ئەمشەو کوورەی ئاشوبێکی تر دادەگیرسێن
ئەمشەو دەروێشە نەزۆکەکانی خۆشەویستی
شووشەی چرایەکان دەکرۆژن و بە نووکی شنشێرە تیژەکانیان
لەسەر دیوارە قوڕەکان دەنووسن
بژی ڕەشەبا
بژی ئافات
بژی ئاشوب

هاوارە لەم ژانەبرینە
هاوارە ئەمشەو درەختی مێژوو ژانی گرتووە
هەناسە سوارە
ئەمشەو ماسیەکان لە ژێر ئاودا
دەسووتێن و
چاوی پەپوولەکانیش پڕ تیزاب دەکەن
هاوارە ،
ئەم وەرزە ، وەرزی کۆچ و خنکان و سووتانە
وەرزی هەڵکشانی با و وەرزی کوشتنی
گوڵاڵەسوورە و وەرزی زەماوەندی سێدارەیە
هاوارە لەم ژانە هاوارە
ئەمشە و تایفەی ( کلارا و ڕۆزاییەکان ) سەر دەبڕن و
( مایندەکەی نەژادیش ) * قۆڵبەست دەکەن
ئەمشەو ڤیستیڤالی پێناسەی مەرگ دەست پێدەکات و
چارەنووسی مێژوو بۆ بیست سەدەی تر دیاری دەکەن

هاواره
ئەمشەو شەوی لە سێدارەدانی تریفەی مانگ و
شەوی خنکاندنی کازیوە و
شەوی پچڕاندنی وەتەرەکانی گیتاری شیعرە
ئەمشەو لە نێو سەمفۆنیای هاواری قاڕژنی بزنی مێژوو
دەروێشەکان هەیکەلی خوا ماچ دەکەن و
مەسیح لە خاچ دەدەنەوە

---

- ماینەکەی نەژاد : گەیشتن بە هیوا

ئاخ ئەم وەرزە ،
وەرزی لە دایکبوونەوەی " ملۆزمەی ئافات " و
وەرزی ڕەقبوونەوەی زەڕنەقووتە و
وەرزی ماچکردنی کێلی مردووەکانە
ئاخ ئەم وەرزە ئاخ ..!

گوڵەکەی من
ئەم وەرزە ، وەرزی قڕانی زیندەوەرە
وەرزی سەربڕینی گوڵەگەنم و قرچەقرچی سووتانی نانە
لەم وەرزی خنکان و سووتان و مردنەدا
دەپێم بڵێ گوڵە گیان ؟
بە کام بەستە و لاوک و حەیران دڵت خۆش دەبێتەوە ؟

گوڵەکەی من
کاتێک دەخنکێم و دەمدەن بە دەمی ڕووبارەوە
دڵتەنگ مەبە
من لە ناو پێشانگای خنکانیش دا
ئەو تابلۆیە زیندووەم نم نم وەکو باران
دادەبارێمەوە سەر پەڕەی لێوەکانت
من لە ناو خنکانیش دا
بە پەڕەکانی تۆ باسکەمەلە دەکەم و
لەسەر پەڕەکانی تۆش دەنووم و
خەونی خۆش خۆشیش دەبینم ...!

فڕین فڕین ، دەڕۆین لەناو خوێن دا گەوز دەدەین
ڕۆیشتن و کۆچ ، دەڕۆین لەسەرمانا ڕەق دەبینەوە
بستە خاکێک نەماوە نەبێتە ئارامگای زارۆکان
پەناگەیەک نەماوە ، لەژێر بارانی ترس شرە خیوەتی
لێ هەڵنەدرابێ ...!
کۆچی ئەمجارەمان گوڵەسوورە و پەپوولەشی لەگەڵ خۆیدا هێناوە
فڕین فڕین ، فڕین بەرەو ئاسمانی بەفر و بەرە و وڵاتی بەفر و
بەرەو کیشوەرەکانی تاشەبەرد ...!

گوڵەکەی من ، تۆ لە کوێ بووی ؟
من لە کاتی کۆچ و مردنم دا دەریاچەیەک فرمێسکم هەڵڕشت
خۆم بە غەریب هاتە بەرچاو
هێشتا ڕەشبەڵەکی لە دایکبوونم کۆتایی پێ نەهاتبوو
لە سەر پشتی کلۆبەفر دایاننام
تاکو هەردوو پێ و هەموو جەستەم سڕ ببێ
چیتر نەتوانم گوڵە سوورەکەی خۆم ماچ بکەم
ئاخ ، دەنگم نووساوە و ڕۆحم تنۆک تنۆک خوێنێ لێدێ

گوڵە گیان
ئێستا من غەریبم و تۆش غەریبی
دە وەکو شەوی لە دایکبوونم لەم غەریبیەدا
بملاوێنەوە تاکو منیش ڕاتهەژێنم
دەلەم غەریبیەدا
ماچم بکە ، تاکو منیش
پڕ بە سیەکانم تێر تێر بۆنت بکەم
لەم شەوە تاریکستانەدا
لەسەر پشتی کلۆبەفر ، مانگ مۆڕەم لێدەکات و
تارمایی خیوەتەکانیش دەمترسێنن
گوڵەکەی من
لەم پێدەشتی غەریبیەدا من برسیمە
دە بۆم ببە بە لەتێک نان و تاکو منیش
تۆزێک تینم بێتەوە بەر
دە بەسینگی خۆتم بنووسێنەوە و فرمێسکەکانم بسترەوە و
من لە شەوانی کۆچ و مردن
لە سەفەرە دوورەکانم ، هەمیشە حەزدەکەم تۆم لەگەل دا بێ
بۆ ئەوەی جار جارە لە ئامێزی گەرمت سەرخەوێ بشکێنم و پاشان

تێر تێر ماچت بکەم و ئازارەکانم بڕەوێنمەوە
ئاخ ...! گوڵە گیان ،
چەند غەریبم دە تۆش ماچم بکە
دە وەکو پەپوولە شیلەی ناخم هەڵمژە
دە بم مژە ، مەمکەکانم ، سەری پەنجەکانم ، هەموو لەشم
دەی گوڵە گیان ، دە ئارەقەی ئەم غەریبیەم بلێسەوە و
بۆ ناو سیەکانت هەلم مژە
دەی گوڵە گیان دەی . من لە کاتی سەرەمەرگیش
بە بینینت ڕاست دەبمەوە و دەست بە سەمای
عەشقم دەکەم ! دەی گولە گیان
دە ماچم کە ، دەبم گوشە ، دەبم مژە
دەی گوڵە گیان ، دەی دەی دەی

بۆن دێ
بۆنی لاشەی گەنیو ، بۆنی بارووت و بۆسۆ دێ ...!
هەوای ئاسمانی ئەم وەرزە چەندە پیسە
هەوای نێو ئەشکەوتەکانی ئەم وەرزە چەندە پیسە

پیس پیس
پیستر لە ڕدێنە چلکنەکەی دەروێشەکانی خوا
پیستر لە ڕشانەوەی بێغەمبەرەکانی خوا
پیس پیس پیس
زۆر دەترسم ، لە ناو ئەم ئەشکەوتە تاریکەدا
ئاوێنەی چاوی گوڵەسوورەکەم ببێتە سەراب و
ماچ و توانەوە و پێکەنینم ببێتە خەون ...!
دەترسم جارێکی تریش زمانم بگیرێ و
ناوی خۆم بیر بچێتەوە
دەترسم ، دەترسم ، دەترسم
ئای ...! سەرابەکانی ئەم وەرزە چەندە لیٚلن ...!
شەقامەکانی ئەم وەرزە چەندە لێژن
دەپێم بڵێ گوڵەکەی من
دەبێ دڵی ئەم وەرزە بۆگەنە چی تێدابێ چی ...!؟
ئاخ خخخخخخخخخخخخخخخ !
نازانم کام دیمەنی ئەم ژانە برینەم پیشان بدەم ؟
گەڕانەوە بۆ ناو سکی دایک و زەوی
یان گەڕانەوە بۆ ئامێزی مەرگ ؟

خۆمەلاسدان لەناو ئەشکەوتەکانی وڵاتی بەرد
یان گرتنی لغاویماینی ڕێی هات و نەهات و
فڕین بەرە و ئاسمانێکی تر ...!

گوڵەکەی من
ئەو ساتەوەختەشم قەت لە بیرناچێ
کە بەبەرچاوی خۆمەوە هەموو پەڕەکانت هەڵدەوەرین
کەوتنە نێو درزەکانی سکی زەوی
ئاخ چەند غەریبم گوڵەگیان
غەریبتر لە کچێنی کانی یە وشکەکان
غەریبتر لە هەڵوەرینی پەنجەی مێژوو
ئاخ گوڵە گیان
لەم غەریبی یەدا چاوەکانم هیچ نابینێ و
وەکو ئەو تەپۆڵکە و گردۆڵکانەی قەدپالی چیا بێدەنگم
وەکو ئەو چەمە پڕ لە بەرد و پڕ لە دڕکانەش بێدەنگم
وەکو شەوێکی ترسنۆکی شەختەیی بێدەنگم
لەم تاریسکتانە پڕ نەعلەتییە

( تۆلستۆ ) م بێدەنگە
( دایە جۆنز ) م بێدەنگە
( لانگستۆن هیۆز ) م بێدەنگە
منیش بەبێدەنگی هەناسە دەدەم و خۆم دەکوژم
تا جارێکی تر و سەر لە نوێ
لە دایک ببمەوە و وەکو ئێستام نامۆ نەبم ...!

ئێستا
ڕووباری نێوان مەمکەکانم
ئاوێکی شێڵووی پێدا دەڕوات
ئێستا من لە ناو گێژاوی سەرگەردانی
هاژەی تاڤگەیەکی دڵتەنگم
دەی گوڵە گیان
دەستم دامێنت ئەمجارەش
ماچم بکە و بە سینگی خۆتم بنووسێنەوە
تاکو ببمەوە بە پەپوولە و بە ئاسمانی دڵتا
بێم و بچم

دەی گوڵە گیان
دەوەرە لەسەر نینۆکەکانم
لەسەر پشتی هەردوو دەستم
لەسەر پەرەکانی لێوم ... بڕوێ
تا بە تۆوە بمناسنەوە و لەم غەریبی یەدا
ڕەنگی ڕۆیشتووم بێتەوەبەر
دەی گوڵەگیان
دە ماچم کە
دە بم گوشە
دە بۆنم کە
دەی گوڵەکەی خۆم دەی ...!

سێ یەم :-

لە ناو مەملەکەتی کۆچ و مردن
لە ناو مەملەکەتی گوناە و تاوان
لەناو مەملەکەتی وشکبوونی ڕژینەکانم تامەزرۆیی
جارێکی تریش
چوونەوە خزمەت فیرعەون و
ماچکردنی ڕوومەتەکانی فیرعەون
هاوارە
دیسانەوە نوێژکردن لە ناو مزگەوتی گوناە و
کڕنۆش بردنەوە بۆ فیرعەون ...!
جارێکی تریش ، ماچکردنی شەوەزەنگ
لە ملکردنی گەردانەی شەرم
جارێکی تریش ، چوونەوە ناو قۆزاخەی بێ ئومێدی
هاوارە دیسانەوە
شەو بەسەر بردن لە ژێر خیوەتی پڕ گوناهی
فیرعەونیەکان

دیسانەوە پاڵکەوتن
لەژێر سێبەری داری پڕ کرمی فیرعەونیەکان
هاوارە گوڵەکەی من
من لە خەمی خۆم و لە خەمی تۆ و لە خەمی هەموو
ئەو درەختانەم کە لە نێو دڵی بەهار لە دایک دەبن
ئەم دۆزەخە لە سەر سینگی مەرگ لە دایک بووە
ئەم دۆزەخە مارشی خوێن مژینم بۆ دەڵێ
ئەم دۆزەخە
بنی پێیەکانم داغ دەکات و برژانگەکانیشم دەسووتێنێ
ئەم دۆزەخە وەرزی لە دایکبوونەوەی
زرە پێکەنینی فیرعەونە
وەرزی لەدایکبوونەوەی
تارمایی ڕەشی چاوەکانی فیرعەونە
بەڵام گوڵەکەم
ڕێبوارانی هەڵوەدای عەشقت
لەم دۆزەخەش لە هەناسەدان نەکەوتوون

ڕۆژ دێ و دەڕوا ، وەرز دێ و دەڕوا ، کۆچ دێ و دەڕوا
مردن و لە دایکبوونەوە
لە دایکبوونەوە و هەناسەدان
هەناسەدان و پێگرتن
پێگرتن و گەورەبوون
گەورەبوون و گەورەبوون
باران ، گوڵ ، نان ، گۆرانی ، سەما
بێ ئومێد مەبە ، گوڵە گیان ، بێ ئومێد مەبە ..!

ئێستا هەلوەدا و دڵدارانت
بەبۆن و ڕەنگی تۆوە هەناسە دەدەن
گوڵەکەی من
هەرچەندە
ئەم دۆزەخە وەرزی لە دایکبوونەوەی تۆ نەبوو
بەڵام ،
ئێستا تۆ خۆشترین ئاوازی گۆرانیەکانی مێژووی
بووی بە یەکەم تاقیگەی ژیانەوەو لە دایکبوونی

ئەم مەملەکەتە
بووی بە یەکەم ، تاقیگە
بۆ دیاریکردنی ڤایرۆسەکانی وەرزی گرانی
بێ ئومێد مەبە گوڵەگیان بێ ئومێد مەبە
لە ناو دڵە ڕاوکێ و هەناسەدانی بە ترس
ڕۆیشتن بەسەر مەقەلەی پڕ لە پشکۆی ئاگر
دووبارە ڕێگاوبانەکان بزمارڕێژ کرانەوە
دووبارە ئاوی گومانەکان شەختەیان کردەوە
باڵندەکان ، ئەمجارە کۆچیان کرد و نەگەڕانەوە
لە ناو وەرزی شەختەو وەرزی نێوچاوان مۆرکردن
سییەکانم بە سێ بۆڕی هەناسە دەدەن
هەر یەکێک لە چاوەکانم سێ برژانگی هەیە
یەر یەکێک لە مەمکەکانم سێ گۆی هەیە
ئێستا من سێ کەسم
کۆرسی سروودەکەشم سێ ڕیزە
ناو دەمیشم سێ زمانی تێدایە

ئاخ گوڵە گیان
دەزانم ئێستا تۆش هەست بە ئازارەکانی من دەکەیت و
دڵنیام تۆش وەکو من دەڵێی
دەبێ کەی بێ ؟
سییەکانم بە یەک بۆڕی هەناسە بدەن
هەر یەکێک لە چاوەکانم یەک برژانگی هەبێت
من یەک کەس بم
ناو دەمیشم یەک زمانی تێدابێ و
کۆرسی سروودەکەشم یەک ڕیز بێت
ئاخ گوڵەکەی من
دەبێ کەی بێ ؟
دەبێ کەی دەبێ کەی ...؟!

لە ناو مەملەکەتی بێ ئاسمان و بێ پەلکەزێڕینە و
بێ هەور
دەبێ ببم با ئاسمان و ببم بە مانگ و بە ئەستێرە
دەبێ ببم بە هەناسەی درەخت و بە پێکەنینی ماسی
دەبێ ببم بە بێشکە و بە ئاوێنە و سەراب

گوڵەکەی خۆم
من چۆن دەتوانم ببم بە گۆرانیەکانی
ڕۆحی بەلکەزیرِینە
کاتێک ڕقم لە چاویلکەکانی خۆم دەبێتەوە ...!
من چۆن دەتوانم
لەم شەڕە خۆم دەرباز بکەم
گەر بە شمشێری دارەوە بچمە شەڕ ؟!
چۆن دەتوانم
دەمامکە ڕەنگاوڕەنگەکان
پچڕپچڕ بکەم گەر دەستەکانم بێ پەنجە بن ..؟!

ئای گوڵە گیان
ئەوە منم وەکو سێعربازەکان و دەروێشە
زیکرکارەکان
درۆدەکەم و لەسەر بەرماڵی خەون ڕاکشاوم
ئای گوڵە گیان !
ئەم وەرزە وەرزی چنینی دەمامک و
وەرزی دابەشکردنی دەمامکە

دەمامکی ڕەنگاوڕەنگ و دەستەسڕی ڕەنگاوڕەنگ
پشتێنی ڕەنگاوڕەنگ و پارچە پەڕۆی ڕەنگاوڕەنگ
دیواری ڕەنگاوڕەنگ و قوتابخانەی ڕەنگاوڕەنگ
مامۆستای ڕەنگاوڕەنگ و پێغەمبەری ڕەنگاوڕەنگ و
خوای ڕەنگاورەنگ و ئاسمان و دنیای رەنگاورەنگ ...!

گوڵەکەی من
دەپێم بڵێ .. چۆن شەپۆلی ڕەنگێک لوولمان نادات
گەر کەشتیەکەی نوحمان نەبێت ؟!

لە ناو مەملەکەتی درۆ و تاوان و دەمامکدا
دەمامک چنینەکان قەڵایەکی تازەیان
دروست کردووە
ئێستا گۆرانیەکانی ئەم دۆزەخە لەگەڵ
خەونە ڕەنگاورەنگەکان تێکەڵ بەیەک بوونە و
ئاوازێکی بێ سۆز و بێ گیان دەڵێنەوە

ئێستا چوونە ناو ئامێزی یەکتری شەوانەمان
وەکوجاران گەرمم ناکاتەوە

ئای گوڵە گیان
لەم مەلەکەتەدا
ئێستا ، گولی دۆزەخی بۆن دەکەن
دەمامکی دۆزەخی لەسەر دەکەن و
دەسرۆکەی دۆزەخیش بادەدەن !

گوڵەکەی من
بۆ ئەوەی زیاتر لەبەر گڕی ئەم گەرمایە
سەرم نەڕووتێتەوە
چیتر شەڕ لەگەڵ خۆمدا ناکەم
ئێسکی پەراسووەکانی خۆم ناکرۆژم
چیتر دڕک لە پێیەکانی خۆم ڕاناکەم و
ئاوی چاوەکانی خۆم نارژێنم ..!
چیتر چاوم بەرایی نادات سەیری پەنجە

سڕبووەکانی خۆم بکەم
من دەمەوێت خۆم بکوژم
تاکو جارێکی تر لە دایک ببمەوە و
پەنجەکانم گەرم بن ...!

گوڵە گیان
ڕێگام دوورە بەم هاوینەش واخەریکە
لە تێنوواندا دەخنکێم
ئەو شەوانە بێزارم دەکەن
کە نەمتوانی
شیعرە ناسکەکانی دیوانی چاوت بخوێنمەوە
ئەو شەوانە ئازارم دەدەن
کە نەمتوانی
تەنها نامەیەکت بۆ بنووسم ...!

من ناتوانم ، هەمیشە بە دیار دارسێوە نەخۆشەکانی
چاوی خۆم بگرییێم
من ناتوانم ، هەمیشە لە چاوەڕوانی گۆدۆیەک دا بم
بێ گوڵ و بێ شیعر بژیم ..!

گوڵەکەی خۆم
بۆ ئەوەی لە شەوە شەختەییەکان ڕزگارم بێ
بۆ ئەوەی جارێکی تر
بە منداڵی گۆرانیەکانی پیری نەڵێمەوە
بڕیارم دا
هەرسێ زمانەکانی ناو دەمم بکەم بەیەک
هەر سێ مەتارەکانی ئاوم بکەم بەیەک
منیش ،
مۆمی لە دایکبوونەوەم هەڵبکەم
منیش ببم بە ڕووبارێک
گێلکەگانی چواردەوری خۆم ئاو بدەم ..!
گوڵەکەی من دەبم بینە
هەتاکەی دەستت لە ئەژنۆکانت نابێتەوە ..!

دەبم بینە
خۆ ئێستاکە
لە تۆ زیاتر
هیچ گوڵێکی ترم خۆش ناوێت

تەنانەت لەگەل خوداش دا ناجمە ژوان و
چیتر لە گەلیدا جووت نابم ..!
دەبم بینە
بەم تەمموزە وا زەماوەندی لە دایکبوونم دەگێڕدرێ
دڵتەنگ مەبە گوڵەکەی من
تا هەناسەدانی زیندەوەرەکان و
هەناسەدانی گژوگیا مابێ
من و تۆش ...
هەمیشە هەر لە دایک دەبینەوە
گولەکەی من
من بە تەنها لە چاوەڕوانی تۆ دام
تەنها بە تۆ دڵم بەختیار دەبێ
ئێستا
شیعر بۆ لە دایکبوونەوەی تۆ دەنووسم
چاوەڕێمە تۆش  کۆشێک سێوی شیرینم بۆ بێنی
چاوەڕێمە ، چاوەڕێمە چاوەڕێ
گوڵەکەی من

من لە پێناو لە دایکبوونەوەی تۆ دەژیم و
دڵنیاشم کەس وەکو من تۆ ناناسێ و
کەسیش وەکو من
تۆی خۆش ناوێ نا ...!

چوارەم :-

عەشق لە ناو قۆزاخەی سڕبوون ، بێ بەهایە
بارانێک بۆ گوڵ نەبارێت مردنە
بە قەد دوو تەمەنی کۆرپەلەییم
لە ناو قۆزاخەی سڕبووندا بووم ...!
بە قەد دوو تەمەنی کۆرپەلەییم دەڵەمەبووم
ئاخ ...!
چ ئازارێکە هەناسەی درێژی گەریدەییم ؟!
من لە هەمووتان ڕاستگۆ ترم
بۆیە پەنجەکانم خوێنیان لێ دێ و
مەلۆتکەی عەشقی سپیم ژاندەیگرێ
عەشقم بێگوناهە
عەشق نەبووایە من خۆم نەدەناسی
گوڵەکەی من
من خۆشەویسترین درەختی عەشق و
سەوزترین بەهاری عەشقم

قەت بیرم ناچێ
لە ناو زامەکانی عەشق و سەفەری عەشق
لە ناو گریانی عەشق و مردنی عەشق
چوار وەرزی تەمەن و
چوار بەهاری ڕۆحم تێپەڕی ...!

گوڵە گیان

ئێستا من گەنج بوومەتەوە و عاشقێکی شۆخ و شەنگم
دەمەوێ بە ناو کۆڵانە پێچاوپێچەکانی ڕۆحی عەشق شۆڕ ببمەوە
دەمەوێ لەناو ئەزمونەکانی عەشق فەیلەسوفێکی ڕیش سپی بم
بە عەشقم
سەرلە نوێ ژیان دروست بکەمەوە..!
من شاعیرێکی عاشقم
دەمەوێ کوکوختیە پیرەکان وەکو خۆم گەنج بکەمەوەو
دەرسی عەشقیان پێ بلێم
دەمەوێ گوێم لە چرپەی گریان نەبێ و

ماسییە دڵخۆشەکان لە سەمای خۆیان نەکەون
گوڵەکەی خۆم
ئێستا وەرزی پیربوونم تێپەڕیوە ، سینگم گێلگەیەکی تەڕە
ئێستا دەتوانم باڵۆنەکانی تۆفان و
باڵۆنەکانی بوومەلەرزە و باڵۆنەکانی ڕەشەبا
کون کون بکەم
من پەیامی لە دایکبوونەوەی حەقیقەتم
سروشت بە سییەکانم هەناسە دەدات
من لە هەموو ئەستێرەکان بڵندترم
ئای گوڵە گیان چەند دڵخۆشم ئای ...!
گوڵەکەی خۆم
لەسەر لێوی پێدەشتەکانی ئەم وەرزە
لەو ڕۆژەوەی ڕەشەبا چنگی لە گەردنی
گوڵە گەنم گیرکردووە
گوڵەگەنم ڕۆیشتووە نەگەڕاوەتەوە

پرسیار پرسیار پرسیار
ئێستا هەموو زیندەوەرەکان چاوەڕیی
گوڵەگەنم دەکەن
ئێستا هەموو هێندە غەریبی گوڵەگەنم دەکەن
تا لە غەریبی و چاوەڕوانی دا شەکەت کەوتوون
ئەم دەڤەرە بێ گوڵەگەنم غەریبە ...!

من دەمەوێ ، بە هەناسەم بژیێنمەوە و
کاسەی چاوەروانی و غەریبیتان بشکێنم
وەرن لەگەل منا سەما بکەن
لە ناو لەپی دەستی من گولەسوور چاوی هەلێناوەتەوە و
وا گۆرانیتان بۆ دەڵێ ..!
دە گوێ ڕاگرن
دە باوەشێنەکانتان بە دەستەوە بگرن
پشکۆی چاوە گەشەکەی ئەم گوڵەسوورەی من
باوەشێن بکەن و
خۆڵەمێشی غەریبیش بکەن بە دەمی دەریاوە

ئۆخەی گوله گیان
وا له ناو دۆزەخی مردن و مەملەکەتی برسیەتی
ڕەشبەڵەکی له دایکبوونەوەی تۆ و
ڕەشبەڵەکی مارەبڕینی دایک و باوکمه وا دەنگی دێ

ئۆخەی گوڵه گیان ئۆخەی !
وا لەناو دۆزەخی گومان و مەملەکەتی دەمامک دا
ڕەشبەڵەکی خۆرەتاوی ڕۆحی منه
ڕەشبەڵەکی گوڵەسوورەی ڕۆحی منه
ڕەشبەڵەکی له دایکبوونەوە و هەستانەوەی ڕۆحی منه
وا دەنگی دێ ..!

ئۆخەی گولەگیان ئۆخەی
ڕەشبەڵەکه ڕەشبەڵەکه ڕەشبەڵەک ...!

کۆتایی ئاياری ١٩٩٥

لەو ڕۆژەوەی شیعر
تێنوێتی دەمارەکانی ڕۆحم دەشکێنێ
هەموو کونە بچکۆڵەکانی پێستم بوونەتە
کانی عەشق
بۆیە هەموو شەوێ
گەر قاپێک شیلەی گوڵ و پەرداخێک
شەڕابی عەشق نەخۆمەوە ، دەبێ خۆم بکوژم
من لە مەملەکەتی عەشقەوە هاتووم
بە بۆکڕوزی ئەم پێدەشتە سپیەکانم
ڕەش دەبن
هاتووم هەناسە بهێنمەوە بەر گوڵەگەنم و
درەختەکانی عەشقیش موتوربە بکەم



---

# Spirit Dance

## Poems by

## Nala Hassan

**1996**